# پڕۆژەی
# بەکوردییکردنی
# زانست و خوێندنی باڵا





**دوکتۆر فازیل قەفتان**
دوکتۆرا لە ئابووریی پیشەسازیی

- ناوی کتێب: پڕۆژەی بە کوردییکردنی زانست و خوێندنی باڵا
- نووسەر : د. فازیل قەفتان
- بابەت : زمانی بونیادنان و ئاخاوتن و ئاخاوتن / وانەبێژیی
- هەڵەبڕیی و دیزاینی ناوەڕۆك : مەریوان قەفتان
- دیزاینی بەرگ : جەلیل حسێن
- سەرپەرشتیاری چاپ : مەریوان قەفتان
- تیراژ : ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە : پیرەمێرد
- نۆبەتی چاپ : یەکەم چاپ

لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە سپاردنی (١٤٤٥) ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە


## تێچووی لەچاپدان

## لەلایەن بەڕێز دکتۆر "فەرەیدون قەفتان"

٤٠٩,٠٧١

ف ٢٣٤ فازیل قەفتان

پرۆژەی بە کوردییکردنی زانست وخوێندنی باڵا/فازیل قەفتان . - چ ١. -

سلێمانی - پرۆژەی قەفتان چاپخانەی پیرەمێرد ، ٢٠١٩

٤٨ ل ١٤,٨ سم X ٢١ سم

١. زمانی بونیادنان و ئاخاوتن ٢. وانەبێژیی (تدریس)

٣. ناونیشان

**پرۆژەی قەفتان**

لە بڵاوکراوەکانی :

**پرۆژەی قەفتان بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە - (٦)**

# ئــەم پڕۆژەیــە پێکدێت لــە :

## ١. پێشەکییەک :

( بۆچی پێویستە زانست بە کوردیی بخوێندرێت؟ )

## ٢. بەشی یەکەم :

( بۆچی دەبێت خوێندنی باڵا بە زمانی زگماکی کوردیی بخوێندرێ؟ )

## ٣. بەشی دووەم :

( هەندێك سەرنج و کـاری چەسپـاو )

## ٤. بەشی سێیـەم :

( پێداویستیـیە سەرەکییـەکانی پرۆژەکە )

# مشروع
# تدريس العلوم والدراسات العليـا
# باللغة الكرديـة

## هذا المشروع يبحث عن مبررات تدريس العلوم باللغة الكردية و هو في ثلاث اجزاء :

### الجزء الأول :

**لماذا يجب أن ندرس الدراسات العليا باللغة الكردية "لغة الأم"**

### الجزءالثاني :

**بعض من  الملاحظات**

### الجزءالثالث :

**الأحتياجـات الرئيسية للمشروع**

# PROJECT OF TEACHING THE SCIENCES & HIGHER EDUCATION IN KURDISH LANGUAGE

## By: Dr. Fadhil Kaftan

Ph.D. In Industrial Economy
This project talks about reasons why the sciences should be taught in mother Kurdish language.

**The first part:**
(why the higher education should be taught in Kurdish language).

**The second part:**
(some notices).

**The third part:**
(The main requirements of the project).

# ژیاننامەی دکتۆر فاضل قەفتان

ناوی ( **محمد فاضل محمد عەزیز قەفتان** )ە ، لە ساڵی ١٩٤٣ لە شاری سلێمانی لەدایکبووە و تیایدا خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی خالیدیەی کوڕان و خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی ویژەیی لەسلێمانی و خوێندنی کۆلێجی بەڕێوەبردن و ئابووری لە زانکۆی بەغداد تەواو کردووەو وەکو فەرمانبەر لە زانکۆی سلێمانی دامەزراوە.

لە تەمموزی ساڵی ١٩٧٥ و لە وڵاتی ڕۆمانیا بڕوانامەی دکتۆرای لە ئابووری پیشەسازییدا بەدەستهێناوە و لە ساڵی ١٩٧٦ دا لە زانکۆی سلێمانی بووە بە مامۆستاو ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە لە پێشخستنی زانکۆدا و جگە لە کاری مامۆستایی ئەمینداری گشتی کتێبخانەی زانکۆ بووەو سەرپەرشتی دەرچوونی چەندین گۆڤاری لە زانکۆدا کردووە.

پاش گواستنەوەی زانکۆی سلێمانی بۆ شاری هەولێر بە ماوەیەکی کورت لەبەر پشتگیریکردن و هاندانی خوێندکارانی زانکۆ دژی ڕژێمی فاشستی بەعسیی لە زانکۆ دوورخرایەوە بۆ کۆمپانیای شەکر و لەوێشەوە بۆ فەرمانگەی ئامار لە شاری سلێمانی و پاشان لەسەر داوای ڕژێم بۆ پڕکردنەوەی کۆلێجە بێ مامۆستاکان گەڕایەوە بۆ زانکۆی سەلاحەدین و بە پلەی

پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە کۆلیجی ئابووری درێژەی بە کارەکانی دا.. دواتریش چەندین لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی بە ئەنجام گەیاند.. دەستێکی باڵای هەبوو لە نووسینی ئەدەبیدا و خۆشنووسێکی دیارو بێ هاوتا بوو و هەر لەوێش جگە لە کاری مامۆستایەتی بەڕێوەبەری چاپخانەی زانکۆش بوو.

لە ساڵی ١٩٦١ ەوە پەیوەندی بە (پ. د. ك) ەوە کردووە و دواتریش لە نەوەدەکاندا لە (ی. ن. ك.) دا ئەندامێکی چالاك بووە و لە کۆنگرەی (ی. ن. ك.) دا وەك ئەندامێك بەشداری کردووە.

لە ساڵی ١٩٧٠–١٩٧٥بە سەرۆکی کۆمەڵەی قوتابیانی کورد لە ئەوروپا / لقی ڕۆمانیا هەڵبژێردراوە هەروەها لە ساڵی ١٩٧٢ بەسەرۆکی لیژنەی ئامادەکردنی شانزەیەمین کۆنگرەی کۆمەڵەی قوتابیانی کورد لە ئەوروپا کە لە بوخارستی پایتەختی ڕۆمانیا بەستراوە و لەڕێی نامە نووسینەوە توانیویەتی دەنگی گەلی کوردی ستەمدیدە بە زۆربەی زۆری سەرۆکەکانی وڵاتانی جیهان لەو کاتەدا بگەیەنێت.

لە ساڵی ١٩٧٣ دا نوێنەری ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە لە ڕۆمانیا بۆ کۆنفرانسی پارتی لە ئەوروپا و بە ئەندامی لقی شەشی پارتی لە ئەوروپا هەڵئەبژێردرێت.

له ساڵی ١٩٩٢ دا له سەر لیستی سەوز به ئەندامی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان هەڵبژێردراوه و زۆر جێ پەنجەی به کارەکانی یەکەم پەرلەمانی کوردستانەوه دیاربوو.

پاش سەرنەکەوتنی دوو جاری هەوڵی کوشتنی له ساڵی ١٩٩٤ دا کاکه دکتۆر "فازل قەفتان" بۆ دوورکەوتنەوه له دەستی تاوان به چاوی پڕ له فرمێسکەوه و پاش ماچکردنی خاکی کوردستان لەسەر سنوور ناچار کوردستانی خۆشەویستی خۆی بەرەو ئەوروپا بەجێهێشت و کەوته دووره وڵات و پاش کەمتر له دوو ساڵ که تیایدا چەندین چالاکی نەتەوەیی بەئەنجام گەیاند دڵه گەوره تینووەکەی به خاکی کوردستان له وڵاتی ئەڵەمانیا له ڕۆژی ١٥/ ٥/ ١٩٩٦ له لێدان کەوت و له ڕۆژی ١٩٩٦/٥/٢١ دا له شاری (**دارمشتاد**) ی ئەڵەمانیا تەرمەکەی به خاك سپێردرا.

**"ئالان" ، "ئاڤان" و "ئارام" سێ ڕۆڵەی دڵشکاو و لێبەجێماوی ئەون.**

**لەپاش خۆی چەندین بەرهەمی چاپکراو و چاپنەکراوی له هەموو بوارەکاندا بەجێهێشتوه.**

**بەرهەمە چاپکراوەکـانی :**

١- ناميلكەی چالاك : چوار چیرۆك بۆ مندالآن

٢- ناميلكەی من كێم : زانیاریی بۆ مندالآن

٣- گەشتێك بە سروشت و زانستدا

٤- كتێبی كوخەكەی مام تۆم : وەرگێرڕاو بۆ كوردی

٥- كتێبی ڕژێمە ئابورییەكان

٦- التنمية الاقتصادية : بە زمانی عەرەبی

٧- الذهب الأسود : بە زمانی عەرەبی

٨- پڕۆژەی بە كوردییكردنی زانست و خوێندنی بالآ

**جگە لە چەندین بەرهەم و چالاكی كە هەر هەموویان جێ پەنجەی خوالێخۆشبوویان بە تەواوی پێوە دیارە.**

**پیاوێكی كوردپەروەر ، ڕووخۆش ، گەشبین ، لەسەرخۆ ، لێبوردوو ، خۆنەویست و زانا بوو.. مندالآنی زۆر خۆشئەویست و ڕێزی لە هەموو كەسێك ئەگرت و خەونە گەورەكەی كوردستانی گەورە و ئازاد بوو و ئاواتێكی زۆر زۆری لەگەڵ خۆیدا بردە ژێر گڵ ....**

**هەزاران سلآو لە گیانی پاكی كاكە دكتۆر فـازل قەفتـان.**

**نووسینی**

**دكتۆر فـەرەیدون قەفتــان**



**دکتۆر فازیل قەفتــان**

**١٩٤٣ ـ ١٩٩٦**

**بەڵێ لەنــاو قەومی بەسیتــا قـەدری سەنعاتکـار**

**وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا**

## پڕۆژەی
## بە کوردییکردنی زانست و خوێندنی باڵا

د. فازیل قەفتان
دوکتۆرا لە ئابووری پیشەسازیی دا

### پێشەکی :

هەرگیز(بە کوردییکردنی زانست یان زانست بە کوردییکردن) بە هەموو بوار و جۆرەکانیەوە (بە واتای) دەرگا داخستن و خۆجیاکردنەوە و گۆشەگیریی نییە بە ڕووی زمان و میللەتانی دوور و نزیکی جیهان(ەوە)، بەڵکو ڕاستی ئەم مەسەلەیە تەواو پربەپر پێچەوانەی ئەوەیە، واتە لەم ڕێیەوە ئەتەوەی کوردمان دتوانێت پەیوەندیی خۆی زیاتر پتەوتر بکات بە میللەتانی جیهان و زمانەکان یانەوە، بۆ ناسین و شارەزابوونی ئەو ڕادە و ئاستەی ئەو میللەتانە لە ڕووی هونەر و ئەدەب و تێکڕای زانستەوە کە پێیگەیشتوون، چاوێك بە کاروانی هەوڵ و تێکۆشان یاندا بخشێنێ و کەڵك لە ژیانی ڕۆژانەیان وەربگرێت. واتە ئەم کارە هۆکارێکە بۆ دەرگا کردنەوەیەك لە سەر ئەو نهێنیانەی لای ئەوەی کورد هێشتا لێڵە و بە زمانی زگماکی خۆی هێشتا تەواو مێشکی پێ زاخاو نەدراوە.

هەر میللەتێك، بیەوێت بە دوای (زانیاریی و زانست)دا بڕوات و تینووی ئەو ڕێیە بێت، هەمیشە دەبێت هەوڵبدات و بۆ ناسین و فێربوونی ئەو زانستانە (شەوبخاتە سەر ڕۆژ) و

پەرەی میللەتانی پێش خۆی هەڵبداتەوە و کەڵکیان لێوەربگرێ. بێگومان ئەو ڕێ یەشە کە دەمان گەیەنێتە ئەو مەبەستە، هەمیشە هەر گۆڕینی ئەو بوارانەی زانیاریی و زانستە بۆ زمانە شیرینەکەی کوردیی مان، واتە گۆڕینی ئەو کاروانی زانستانە بۆ زمانی کوردیی و دەوڵەمەند کردنی و پەلهاویشتنی لە هەموو بوارەکان دا بێ جیاوازیی و پاشان هەوڵدان بۆ تەشەنە پێدان و گەشە پێکردنی لە لایەن نەوەکانی داهاتووەوە، تا بتوانرێت زمانێکی زانستیی لێ دروست بکرێت و نەوەکان مان بەو زمانە بخوێنن و بیربکەنەوە و پاشە ڕۆژی خۆیانی پێ ڕەچاو بکەن، تاریکی ڕابردووی پێ ڕووناک بکەنەوە، چونکە دەزانین کە (زمان) تەنیا هۆ و هۆکارێکی لە یەک گەیشتن و پەیوەندییکردن نییە و بەس، بەڵکو هۆکارێکی بیرکردنەوە و داهێنانە و هەمیشە هەڵوێست و ژیانە.

جا لەم ڕوویەوە، ئێمە چەند پەلە بکەین و هۆ و هۆکاری پێویستی بۆ بخولقێنین و چاوەڕێ ی ڕێکەوت نەکەین و تەمەڵی لە کار و کردارمان دا نەکەین و هەستی هیمەت و دەستی فراوان مان هەڵکراو و کراوە بێ، هەرگیز سست و داخراو نەبێ، ئەوەندە زووتر بەو ئاواتە پیرۆزە دەگەین چونکە لای هەمووان ڕوونە کە زانست و زانیاریی ئەمڕۆ وەك جاران نییە، بەڵکوو هێندە خێرا دێت و دەڕوات دوورنییە ئەگەر لێ ی بخافڵێین زمان و میللەتەکە مان زۆر زیاتر تووشی چەرمەسەریی تری

دواکەوتن نەبێت، چونکە سەدە سەدەی تەقینەوەی زانیاریی و زانستە و هەر چرکەیەك و هەر ساتێك شتێکی نوێ و تازەتر دەخولقێ و مافی ڕەوای میللەتی کوردی نازاشە کە کەڵك لە زانست و زانیاریی یانەی پێ مسۆگەر بکات.

کە دەڵێین :

مافی میللەتی کوردە وەك هەموو میللەتێك لە میللەتانی سەر ڕووی زەمین، چونکە زانست و زانیاریی و پێشکەوتن هەرگیز موڵکی دەستە و کۆمەڵێك یان تەنیا میللەتێك یان چەند میللەتێکی جیهان نین و(زانست و زانیاریی) بێسنوورە و هەرگیز گومان لەوەدا نییە کە باو و باپیرانی ئێمەش لە کاروانی ئەو زانست و زانیاریی یانە کە ئەمڕۆ لە برەودان هاوبەشیی یان کردووە، ئەگەر چاوێك بە مێژووی زانست دا بخشێنینەوە هەمیشە دەیان زانا و شارەزا و فەیلەسوف و بیرکەرەوەی بە ناوبانگ و ناودارێکی قەشەنگی کورد سەرهەڵ دەبڕن و مایەی خۆشحاڵی و شانازیی میللەت مان پێ دەبەخشن کە هاوبەشیی یان لە (بناغەی زانست)دا بووە و خزمەتی مرۆڤایەتیی ئەوسایان کردووە و لەم ڕووەوە دەیسەلمێنن کە هەرگیز میللەتی کورد بێبەش نییە و (مێژوو) ش هەمیشە شایەتە و زمانڕاستی گەلانی بەشخوراو و چەوساوەیە.

جا لێرەدا دەڵێین : کە (گۆڕینی زانیاریی و زانست) لە زمانی گەلانی جیهانەوە بۆ زمانی کوردیی مان هەمیشە قەشەنگترین و پیرۆزترین ڕێگایە کە دەرگایەکی پێشەکەوتن مان لێدەکاتەوە و هەنگاونانێکی پیرۆزە کە لە قۆناغێکی لێڵ و تاریکەوە دەمانخاتە نێو قۆناغێکی نوێی پڕ لە سەرکەوتنەوە.

بۆ ئەم مەبەستەش (زمانی زانستیی کوردیی) و خولقاندنی و گەشە پێکردنی، دەستبەرداری زمانەوان و شارەزا و پسپۆڕە دڵسۆزەکان دەبێ و هەمیشە چاوی لە بەرهەم و بیرکردنەوەی ئەوان دەبێ کە ( چۆن و کەی ) ئەو هەنگاوە پیرۆزە دەنرێت و کەی ئەو بەردە زێڕینە بە دەست و مەچەکی کوردی دڵسۆز بناغەی دەدەنەوە و وێنەی دەست پێکردن و خولقاندن و گەشەپێکردن و ئەشوونوماکردنی بە لێزانانەوە بۆ دەکێشن؟؟

گومانی تێدا نی‌یە کە ئەم کارە، واتە گۆڕینی هەموو ئەو زانست و زانیاریی یانەی میللەتانی پێشکەوتووی جیهان پێی گەیشتوون و بە کوردیی‌کردنیان هەمیشە بڵێسەیەکی بیر و بیرکردنەوەیەکی بە پێت و دەوڵەمەند دەخولقێنێ و وەك دەرمانێکی سارێژکەر وایە بۆ برینەکانی ئەم میللەتەمان و هەمیشە پاڵپێوەنەرێکی بە تەوژم دەبێت کە هێز و توانا بە کاروانی پێشکەوتن و ڕەوڕەوەی گەشەکردن مان دەدا و لە پەنگ خواردوویی ڕزگارمان دەکات.

# بەشی یەکەم
## بۆچی دەبێت
## (خوێندنی باڵا بە زمانی زگماکی کوردییمان بێت)؟

خوێندن و بە تایبەتی خوێندنی باڵا خوێندنی زانکۆ بە زمانی زگماکی میللەتێك کارێکی نەفسیی و پەروەردەییە، کێشەکە بەش بە حاڵی خۆی چەندین ڕا و بۆچوونی جیاواز دەخولقێنێت!!

بەڵام کێشەکە خۆی لە خۆی دا لە ڕوانگەیەکی ویژدانیی یەوە ئەوەیە کەهەر میللەتێك دەیەوێت کەلەپوور و مێژووی بوونی خۆی بسەلمێنێ و هەمیشە پەیوەندیشی هەیە بە کرداری بیر و بیرکردنەوەی مێشکی مرۆڤ و ئەوەی شایانی باسە ئەم مەسەلەیە زۆر پەیوەندیی بە زانستی دەروون ناسیی زمانەوانیی یەوە – علم النفس اللغوي- هەیە. مێشکی مرۆڤ کە توانای لە سەرووی مێشکی هەموو زیندەوەرەکانی ترەوەیە، پەنای بردۆتە بەر (زمان) و لە ئەنجامی گەشەکردن ونەشوونوما کردنی مێشکی مرۆڤ دا زمانی خولقاندووە، نیشانە و وێنەی بەکار هێناوە کە لە دوایی دا بوونەتە ( ووتە ) و قسەیان پێکردووە و ئینجا بوونەتە (ووشە) و پێیان نووسیوە. گومان لەوەدا نییە کە بیرکردنەوەی مرۆڤ بە تەواوی پشتدەبەستێ بە (زمان)ـەوە و هەرگیز ئەو بیرە دەرنابڕێ بێ بەکارهێنانی (زمان) و قسە پێکردنی دەخولقێنێ و وورده وورده دروست تر

و تەواوتر لە مێشکی (منداڵ)دا پێدەگات، چەند ئەو منداڵە تەمەنی گەورەتر بێت ئەوەندە (زمـان) لای تەشەنە دەکات، واتە (زمـان) بە دەستهاتوویەکی کۆمەڵایەتیی ڕۆشنبیریی شارستانێتی ئەو دەوروبەر و ژینگەیەیە کە تێیدا دروست بووە و تێیدا سەری هەڵداوە، ئەو مانایانەی کە دەردەبڕڕێ و دەزانرێت هەمیشە ئەو مانا بەکارهاتووە، ڕووی ڕابوردوو و ئێستای کەسوکار و خەڵکانی هاونیشتمانی ئەو میللەتەن و مانا و واتای هەرشتێك بێت بێگومان پشت دەبەستێ بە ووشە و ڕستەوە و ووشەیەکی بە مانا لە هەر کۆمەڵگایەك و ڕۆشنبیریی یەکدا هەرگیز هەمان مانا و واتا نابەخشێ لە کۆمەڵگا و ڕۆشنبیریی نەتەوەیەکی دیکەدا، بەڵکو جیاوازە، ئەگەر هێما و دەربڕینانە جیهانی ئەبن و تێکرا لە سەری ڕێکنەکەوتبین. وەك نیشانەکانی هاتووچۆ و هێمای وەرزشیی و فیزیک و ماتماتیك و کیمیاگەریی و بوارەکانی تری زانست، ئەمەش تاقیکردنەوەکانی زمان، ڕوونیان کردووەتەوە و تەنانەت ئەو تاقیکردنەوانەیان لە سەر چەندین دەستە و کۆمەڵەی خێڵ و هۆزە سەرەتاییەکان کردووە.

ئەم بنەڕەتە سەرەتاییانەی زانستی دەروونناسیی زمانەوانیی دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە مرۆڤ کاتێ دەستدەکات بە بەکارهێنانی زمانی زگماکی خۆی، ئەوا بەردەوام مانای ئەو شتانەی لە کۆمەڵ و دەوروبەری خۆی دا فێری دەبێ لە مێشکی

دا تۆماری دەكات و لە بیری دا كۆی دەكاتەوە، جا هەرشتێك كە تازە فێری دەبێ، بەندە لە سەر ڕێسایەك لە مانای زمانەوانیی یان لە مانایەكی هێما و نیشانە، كە ئەوانیش بەندن بە ووشە و ڕستەوە، واتە(زمـان) لێرەدا هۆ و هۆكارێكی پەیوەندیی بەستنە لە نێو ژیریی و هۆش و لە نێو خەڵكی و لە نێو ئەندامانی خێزان دا و پاشان لە نێو مامۆستا و قوتابی و خوێندكارا.

كرداری گواستنەوەی بیر بە نیشانە و هێمای لە سەر ڕێكەوتوو هەمیشە لە سەر پێوەرێك هەردەم وادەكات كە (خوێندن) بە زمانی زگماكیی كارێكی ئاسان و ووردەكاریی تر بێت، چونكە خوێنەر (قوتابی و خوێندكار) ئەو هێما و نیشانە زمانەوانییانە بە خێراییەكی بێوێنە و زۆر زوو پێدەزانێ و تێدەگات و بەو پەڕی ڕوونیی یەوە لە هۆشی خۆی دا تۆماری دەكات.

جا لێرەدا، پرسیاری ئەوە دەكەین و دەڵێین (زانینێك) لەو زانینانە لە مێشكی خوێندكارێكی زانكۆدا چی بەسەردادێت لە ڕووی (فەسلەجیی و دەماریی و دەروونیی یەوە كاتێ بە زمانێكی بێگانە ئەو زانینانە دەخوێنێت ؟؟)

لێرەدا دەڵێین كە بە دوو قۆناغ یان دوو كرداردا دەڕوات:

<u>یەكەم</u> وەرگێرانی تەرجەمەیەكی زۆر خێرای ئەو زانینە لە زمانە بێگانەكەوە بۆ زمانی زگماكی خۆی، واتە هێمایەكی بێگانەوە بۆ هێمایەكی ڕەسەن.

**<u>دووەم</u>**   لە نیشانە ڕەسەنەکەوە بۆ مانا یان ئەو واتایەی کە مەبەستە.

جا هەرچەندە ئەو ( خوێندکار )ـە بە توانـا بێ و تواناى تەواویشی بە سەر زمانە بێگانەکەدا بشکێ، بەڵام کارێکی لە مێشکی دا دوو قۆناغ لە کرداری گۆڕینی خێرا ڕوودەدات و دەشێ کە ئەو کارە هەندێ هەڵە و نارێکی بە دوایاندا بێ، بۆیە دەڵێین کە کرداری خوێندنەکەی تا ڕادەیەك تووشی جۆرە سستیی و هێواشیی یەک، یان جۆرە ناتەواویی یەك لە مانا و واتای ئەو شتەی مەبەستە ، دەبێ. بۆیە دەبینین کە گۆڕینی ناسایی تێکستە جیهانییەکان لە ئەدەبیی و هونەریی و فەلسەفیی و زانست تەنیا کەسانێکی کەم هەن کە دوورنی‌یە بە پەنجەی دەست بژمێررێن، کە ئەو توانـا پڕبەپڕ و تەواوەیان هەیە، کە بێ کەموکوڕی گۆڕینەکە بە ئەنجام بگەیێنن، بۆیە (کەم) پەراو هەن گۆڕینەکەی چاپکرابن و دانسقەبن، بەڵام پەراوێکی زۆر هەن لە ژماردن نایەن گۆڕینەکەیان لەو جۆرە باشانە نین، ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی زانستیی دەروونناسیی نوێ، دووپاتی گرنگی ئەوە بکاتەوە کە هەمیشە خوێندن و (خوێندنی باڵا) بەزمانی زگماکی بخوێندرێت، چونکە بە لایەنی کەمەوە ئەو خوێندنە بەو زمانە، ئاسانیی مان بۆ مسۆگەر دەکات لەگەڵ خێرایی تێگەیشتن و قۆستنەوەی و

ووردەکاریی لە وەرگرتن و گواستنەوەی ئەو زانیاریی یانەی بۆ مێشکی خوێنەر، بۆیە دەتوانین لێرە دووپاتی ئەوە بکەینەوە کە خوێندن بە زمانی زگماك و بە تایبەت لەو قۆناغەدا (خوێندنی باڵا) کارێکی تەنیا دەروونی سۆز نی‌یە، بەڵکو کارێکی باسخوازیی و بابەتیی و زانستیی یە.

خۆ ئەگەر ئەم کارەش پڕ بە پڕ زانستییش نەبێ و زانستیی دەروونناسییش دووپاتی ئەوەی نەکردبێتەوە، ئەی بۆچی لە ڕوویەکی سروشتیی و ویژدانیی و مرۆڤایەتیی یەوە ئەم مافە ڕەوا نەبێ و بۆچی پێشێل بکرێت، منداڵێکی کورد ئەو مافەی لێ زەوتبکرێت و زمانێکی تری بە تۆبزیی و زۆرداریی بە سەردا بسەپێنری؟!

کەواتە ( خوێندن بە زمانی زگماك ) مانایەکی نەتەوەیی و میللیی دەگەیێنێت و تێرکردن و خۆراکێکی گیانی ڕەسەنی میللەتە و ئینتمایەکە بۆ ئەو میللەتە خاوەن مافە لە ڕوویەکی کۆمەڵایەتیی یەوە، گەشاندنەوەیەکی یەکێتیی نیشتمانیی یە و لەڕوویەکی زانستییشەوە: ڕەواندنەوەی گیروگرفتە و بڵاوبوونەوەیەك و تەشەنەکردنی زانستە بە زمانی کوردیی مان و خولقاندنی بیر و زمانێکی بیر و زمانێکی زانستیی کوردیی یە و دەرگا کردنەوەیەکە لە بەردەم ئەوەکان مان دا کە هەوڵی تازەکردنەوە و داهێنان بدەن، بە مانای ئەوەی کە میللەتی

ئێمەش وەك میللەتـان تەنیا هەر ئەوە نابن كە كەرەسە و بەروبۆمی خەڵكی میللەتانی تر بگۆڕینە سەر زمانەكەمان و كەڵك لەوان وەرگرین. بەڵكو ئێمەش چاومان لەوەوەیە كە لە سەدەی زانست دا بژین و هاوبەشیی بكەین هەوڵی داهێنان بدەین و هاریكاریی لە شارستانیی دا بكەین، یان بە لایەنی كەمەوە خۆمان بەرەو گۆڕان و پێشكەوتن بەرین، چونكە گومانی تێدا نییە كە (مرۆڤ) دەژی و دەژێتەوە بە بوونی و خولقاویی دەوروبەری، ژینگە جەوێكی گونجاوی وا كە خۆی تیایدا ووریاتر بكاتەوە وتیایدا لێهاتوویی خۆی دەرببڕێ و توانای خۆی بسەلمێنێ و ووزەی مێشك و بازووی بخاتە گەڕ و هەنگاوی بە بەردەوام بەرەو پێشێوە بێوەستـان بنێ.

چونكە نابێ واتێبگەین كە شارستانێتی و پێشكەوتن هەمیشە شتێكە و دەبێ هەر لە دەرەوە بهێنرێن، بەڵكو ڕاستتر ئەوەیە كە تامی پێشكەوتن زیاتر لەوەدایە كە خۆت هاوبەشیی بكەیت لە دروستكردنی ئەندامانێكی بەكەڵك و زانا و ئەوەیەكی نوێی پێشكەوتوو كە شارستانێتی لە نیشتمان دا بخولقێنن و بەرپرسیاری بن. بۆیە دەڵێین كە كاری (خوێندن بە كوردیی) لە زانكۆ و بەكوردییكردنی هەموو زانستەكـان هەمیشە هەنگاوێكی پێویستە بۆ ئەو مەبەستانەی سەرەوەمان و هەردەم نامانج و هیوایـەكی نیشتمانیی و نەتەوەیی و

پەروەردەیی یە، چونکە میللەتی ئێمەش وەك هەر میللەتێکی دوور و نزیك پێویستی بە (لێکۆڵەر و زانا و پسپۆڕی) خۆی هەیە و پێویستی بە کۆمەڵ و نەوەیەکی کوردیی هەیە کە خاوەنی توانای خوێندنی باڵا بێ و بە زمانی خۆی زانست بخوێنێ و خاوەنی هۆکاری لێکۆڵینەوە بێ و بزانن چۆن بیردەکاتەوە و چۆن پەیدەبات بە هەموو ئەو شتانەی تا ئێستا لای وون و شاراوە بوون، بەڵکە واقعی خۆی زیاتر لا ڕوونبێتەوە و ئاسۆی پاشەڕۆژی وێنە بکێشێ و بە وورپایی و بە زانایی و پڕدانایی، هەموو شت هەڵسەنگێنێ و، ئەمانەش بێگومان، هەر لە ڕێی خۆشکردن و دەرگاکردنەوەی زانستە لە بەردەم نەتەوەکەمان و زمانەکەی دا.

جا لێرە هەست بەوە دەکەین کە (زمان) چەند گرینگە و چەند دەورێکی گەورە و باڵای هەیە لە دروستکردنی شارستانیی دا، چونکە ئەگەر زمان هەموو زانستیی پێ بنووسرێت ئەوە هەموو زانست وەك دەریایەکی ڕوونی بەرین دەخرێتە بەردەم ئەندامانی کۆمەڵ و نەك تەنیا ئەو (کۆمەڵە) خەڵکەی کە زمانی بێگانە دەزانن و ئەوانی لێی بێناگـان.

ئەمە جگە لەوەی کە (زمان) هەمیشە هۆکارێکی گرنگە بۆ ڕەسەنکردنی ڕۆشنبیریی نەوەکانی داهاتوو و بنج داکوتانی سەرکەوتن و شارستانییەکی مسۆگەری پاشەڕۆژی نەوەکانمان.

# بەشی دووەم

## هەندێك سەرنج و كاری چەسپاو

هەندێك سەرنج و كاری چەسپاو، كە لەم ڕووەوە نابێ لە بیرمان بچێت وەك :

١- (خوێندن بە زمانی دیكە) هەمیشە دوورخستنەوەی زمانەكەمانە لە زانستەكان و لە كاروانی پێشكەوتنەوە، هەمیشە لە گەشە كردن و تازە بوونەوە دوورمان دەخاتەوە و بەو پێیەش كۆت و زنجیرێك دەكرێتەوە پێمان كە هەرگیز بە كاروانی پێشكەوتن نەگەین و لە ژیانێكی سەرەتاییدا بژین و بچین !!

٢- (نەخوێندن بە زمانی كوردیی)، یان هەر میللەت و نەتەوەیەك بە زمانی خۆی نەخوێنێ ، بریتییە لە جۆرە (سەرلێشێواندنێكی نەوەكان) و بە تایبەت قوتابی و خوێندكارەكانی و لە مێشكیان دا دەچەسپێت كە (زمانەكەیان) هەرگیز شیاو و گونجاو یان بڵێین شایانی ئەوە نییە پێی بخوێندرێت و ناشێت ئەو زمانە ببێتە هۆكارێكی لێكۆڵینەوە و باسپێكردنی زانستیی و بیرپێكردنەوەیان لە هەر بوارێك دا بێ!! ئەو سەرلێشێواندنەش بە ڕۆڵی خۆی دەبێتە هۆی كزبوون و ووشكبوونەوەی تەڕایی پەیوەندی ڕۆحیی و ڕۆشنبیریی بە كەلەپوور و ڕەسەنی ئەو میللەتە و هەمیشە

ئەو هەستە پەردەیەکی ڕەش و چڵکن دەخاتە نێو ئەمــان و ڕۆشنبیریی نەتەوەکەیانەوە.

٣ـ کەواتە بە کوردیی نووسین لە هەموو بوارەکانی زانستدا و لێکۆڵینەوە و باسکردن و خوێندنی باڵا بەم زمانە هەمیشە بۆ زۆربەیەکی زۆری خەڵکی ڕێ خۆش دەکات، چونکە ئەوسا بەگشتی خەڵکی ئەو پەراو و باسە زانستیی یانە دەقۆزنەوە و هەریەك لە بواری خۆیدا کەڵك یان لێوەردەگرێت، بۆ نموونە ئەگەر بە زمانی کوردیی پەراوی زانستیی مان هەبن، بە گشتی هەموو ڕۆشنبیران و کرێکارە لێهاتووە شارەزاکانی بواری پیشەسازیی و کشتوکاڵ و بەڕێوەبەران و هەڵسوڕێنەران و خاوەن کارگە و بەرژەوەندییەکان و دامەزراوەکان یان، هەمیشە ئەو پەراو و باسە زانستیی یانەی زانکۆکان بە زمانی کوردیی چاپی دەکەن، ئەوان بە پەرۆشەوە دەیخوێننەوە و کەڵك لە واتا زانستیی یەکان وەردەگرن و تێکەڵ بە ژیانی ڕۆژانەیان دەکەن.

خاوەن کێڵگە کشتوکاڵیی یەکان و کێڵگەکانی پەروەردەی مریشك و هەموو بوارەکانی ئابووری و چالاکی یە هەمە جۆرەکانی ژیانی ئابووری، تێکڕا پەنا دەبەنە بەر ئەو باسە زانکۆیی یانە و ئەو پەراوە زانستیی یانــە.

سەبارەت بەم مەسەلەیەی سەرەوە کە دووپاتکردنەوەی ئەوەیە کە بە زمانی زگماکی ( کوردیی ) بخوێنرێت و بە تایبەت لە

قۆناغی ( خوێندنی باڵا )، بەش بە حاڵی ڕۆژان و قۆناغی ئەمڕۆماندا ئەو ڕووداوە مێژوویی‌یەی (ژاپۆن )دەخەینە بەرچاو کە (ئەزموندار و شارەزاکانی پیشەسازیی کردنی ژاپۆن دانیان بەوە داناوە) کە ئەوەی یارمەتی ژاپۆنی دا، کە پیشەسازیی ژاپۆن بگەیێنێتە ئەوپەڕی لوتکەی پێشکەوتن و ئەو سەرکەوتنە تەکنۆلۆژیی یە لە وولاتی ژاپۆن دا بەدەستبێت و لە تەنیا (نیوسەدە)دا ئەو ئامانجە بهێنێتە دی ئەوە بوو کە ئەوان تازە و نوێترین بیردۆزیی جێبەجێکردنی تیۆری( تەطبیقی ) پیشەسازیی ئەمریکی و ئەوروپیی یان بە ( زمانی ژاپۆنی ) خستە بەردەم کرێکار و هونەرمەندان و تەکنیکاری شارەزا و پیشەسازیی یەکانی خۆیان و ئەوانیش کەڵك یان لەم کارە تەواو وەرگرت و توانیان لەو تیۆرانە بکۆڵنەوە و داهێنانی تازە و نوێ یان بهاوێژنە سەر وولاتی خۆیان ئەو سەرکەوتنە مەزنە بە ئەنجام بیێنن و هەر سەبارەت بەم خاڵەوە بڕیاری (ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان) دەخەینەوە یادمان کە لە زووەوە ئەوەی پێشنیاز کردووە (کە زانستی پزیشکیی بە زمانی نەتەوەیی بخوێنرێت).

ئایا کاتێ دەڵێین کە هەموو زانست بکەین بە کوردیی و بە زمانێکی زانستیی بە خوێندکاران مان بخوێنین ؟!

مەبەست لەوەیە کە خۆمان لە زمانە دروانسیی و بێگانەکان بدزینەوە و بێبایەخ سەیریان بکەین؟ یان بە پێچەوانەوە دەبێ لەگەڵ ئەوەش‌دا هەوڵی تەواو فێر بوونی ئەو زمانانە بدەین؟!

## لە وەڵام دا دەڵێین کە :

بەلانی کەمەوە دەبێ سەر بکەینە سەر (زمانێکی زیندوو) و گرنگ وەك سەرچاوەیەکی ئەو زانستانە و بۆ هەمان مەبەست بایەخیش بدەین بە زمانە دراوسێیەکانیش و بۆ دەوڵەمەن کردنی زمانەکەمان !!

دەبێت ئەو زمانە سەرەکییە بێگانەیەی هەڵدەبژێردرێ ـ با بڵێین و سەبارەت بە ووڵاتی ئێمەوە تا ڕادەیەك هەردەبێ "زمانی ئینگلیزیی" سەرچاوە بێ و لە زانکۆکان دا و لە هەموو قۆناغەکان‌دا بەردەوام بخوێندرێت، کە واتە هەموو دان بەوە دادەنێین کە ئەمڕۆ مەسەلەی (بە کوردیی کردنی زانست) پێویستی‌یەکی پەروەردەیی و ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتیی و نەتەوەیی‌یە و ئەرکێکی سەرشانی ئەمڕۆمانە، کە پێویستە بە پێی ڕامیاریی و ستراتیجی‌یەکی تایبەتی بۆ مەسەلەکە بچین و نەخشە و پلانێکی ڕێکوپێک ، داری دەستمان بێ تا بە هەڵەدا نەچین و کات بە فیڕۆ نەدەین و بە بێ دواکەوتن لە خزمەتی مەسەلەکەدا بین.

# بەشی سێیەم
# پێداویستییە سەرەکییەکانی
# پـڕۆژەی بەکوردییکردنی بوارەکانی زانست و زانیاریی و خوێندنی باڵا

بێگومان بۆ مەبەستی باسکردنی مەسەلەی بە کوردیی خوێندن لە قوتابخانەکانی کوردستان دا یان (نووسین بە کوردیی) و سازکردنی کاروبـار و مامەڵەکردنی خەڵکی لە فەرمانگەکانی ئەم وولاتەمان دا کاروباری ناوخۆ هەڵسوڕاندن پێویستە هەمیشە :

چاوێك بخشێنینەوە بەو یاسایانەی لە ساڵەکانی پاش ۱۹۲۰ ـەوە دەرچوون کە بە پێی ئەو یاسایانە ڕێدراوە کە لە وولاتی عێراق‌دا بە کوردیی بخوێندرێت و بە کوردیی لەو فەرمانگەیانەدا بنووسرێت و زمانی ڕەسمیی ئەو ناوچەیە بێ، کە زمانی زگماکیی تێکڕای خەڵکییە، هەرچەندە کە ئەو یاسایانە زۆر کاریـان پێنەکراوە و بەڵکوو هەر ساڵـەی بە جۆرێك بووە و هەر قۆناغ و زەمانێك میریی بە ئارەزووی خۆی و بە پێی دەستڕۆیشتنی ڕامیاریی و سوپای خۆی ناوەکەی لە میللەتەکەمان لێڵکردووە بە تۆبزیی و زۆرداریی خۆی ڕێی لە جێبەجێکردنی گرتووە و دەیان کۆسپ و تەگەرەی خستووەتە بـەر.

هەروەك لە بەشەکانی پێشووی ئەم باسەدا، دەستنیشانی ئەوەمان کرد کە هەمیشە دەبێ ( زمانی کوردیی ) بگەیەنرێتە ڕادە و ئاست و پایەیەکی وا کە ئەو زمانە بتوانێ ( مەبەستەکان مان ) بهێنێتە دی و ئەم مەبەستانەش مان لەم خاڵانە دا کۆدەکەینەوە :

## یە کـە م / زمانی کوردیی (بیری) پێبکرێتەوە و زانستی پێ بنووسرێتـەوە :

واتە زمانی کوردیی هێندە دەوڵەمەند بووبێ بە ( زاراوە و دەربڕین ) کە مرۆڤی کورد لە توانای دا بێ بە ئاسانی وەك هەر زمانێکیتر بیری پێبکاتەوە و بچێتە قوڵایی باسکردن و لێکۆڵینەوە و شان بە شانی کاروانی زانست و زانستیی نوێ بڕوات و بەو پێیە ببێتە زمانێکی ( لێکۆڵینەوە ) و ( خوێندن )

ئێمە لێرەدا شتێك دڵی خۆمان بەوە خۆشدەکەین کە بەلایەنی کەمەوە لە ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ـەوە دڵسۆزانی کورد و شارەزایانی پەروەردە و زانست و بە تایبەت دەستەی مامۆستایانی کوردستان هەریەك لە بواری خۆیدا هاوبەشیی کردووە لە دانانی بەردی بناغەی بە کوردیی خوێندن و پەراوەکانی قۆناغی ناوەندیی و ئامادەیی یان لە عەرەبیی‌یەوە گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردیی و جۆرە سەرکەوتنێکی چاکیان

لەو ڕووەوە بە دەستهێنا بوو، بەڵام نەوەمان لە بیر نەچێ کە لەساڵانی ١٩٧٨ و بە دواوە نیتر میریی کەوتە نەوەی کە نەو ( زاراوە زانستیی یانەی ) کەوتبوونە زمانەکەمانەوە قەڵاچۆیان بکات وە هەرچی ( بۆنی ) زانستیی و نزیك لە زاراوەکانی جیهانەوە بێ لایان بەرێت، تا تەنانەت لەو چەند زاراوانەش بێناگا بین و لە کاروانی زانستەوە بێخەبەر بین !!

جا نەگەر نەو قۆناغە سەرەکیی یە لەو ساڵانەوە دەستی پێکردبێ و نەو مامۆستایانەی لە ( قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیی و نامادەیی ) کاریان تێیاکردووە شارەزاییی یەکی تەواویان تێیا پەیداکردبێ و بێگومان نێستا نەوان بەناگان لە هەموو کون و کەلەبەرێکی ناتەواوی نەو قۆناغە و دروستکردنی لیژنەی تایبەتیی هەر لەوان بۆ پێیاچوونەوە و زیادکردنی زانست و کەرەسەی پێویستیتر کە هەمیشە لە گەڵ کاروانی زانستی نوێی نەمڕۆدا بگونجێت، نەوا دەڵێین کە نەم کارە مسۆگەری پتەوی نەو قۆناغەمان بۆ بە نەنجام دێنێ.

قۆناغی دووەمیش کە نێمە لێرەدا نەمەیمان زیاتر لا مەبەستە، قۆناغی ( بە کوردییکردنی زانستەکان و خوێندن بە کوردییە لە زانکۆدا )، کە نەم ( بەش و لایەنە یان ) هەمیشە لە سەر ناستێکی بالاترە و گشت زانستەکان دەگرێتەوە، واتە

گرنگی‌یه‌کی زۆر تایبه‌تییتری ده‌بێ، چونکه قۆناغه‌که قۆناغێکی ئاسان نی‌یه و پێویستی به شاره‌زایان و پسپۆڕی تایبه‌تی ئه‌م بوارانه ده‌بێت و له ( هێندێك ) له‌و بوارانه‌دا ئه‌شێ ئه‌وه‌نده تایبه‌تمه‌ندمان نه‌بێ به‌و کاره هه‌ڵستێت، به‌ڵام بێگومان پشتبه‌ستن به نه‌خشه وپلانێکی چنراو و زانایانه‌ی سفت و ڕێگا بۆ دانـان بۆ هه‌ر هه‌نگاوێك، ئه‌نجامێکی باش و سه‌ر که‌وتوو به مه‌سه‌له‌که ده‌به‌خشێت.

به‌هه‌رحاڵ پـڕۆژه‌که کارێکی پیرۆزه و ده‌بێ هه‌نگاوی شاره‌زایانه و لێهاتوانه‌ی بۆ بنرێت و میلله‌تی کورد ئه‌مڕۆ له توانا و ووزه‌ی‌دایه و ده‌بێ که سه‌رکه‌وتووانه به‌ره‌وپیری بچێ و بێگومان بێت له‌و مه‌سه‌له‌یه دا و هه‌رگیز نابێ که‌سێك یه‌ك و دووی لێ‌بکات و به‌ڵکوو به پێچه‌وانه‌وه ده‌بێ هه‌رکه‌س له شوێنی خۆیه‌وه هاوبه‌شیی بکات و ته‌وژم به ڕه‌وڕه‌وه‌ی بدات و که‌سانێتر له مه‌سه‌له‌که سارد نه‌کاته‌وه چونکه کاروانێکی درێژ خایه‌نه و ده‌یـان ساڵی ده‌وێت.

**بۆ ئه‌و مه‌سه‌له‌یه یان ئه‌و پرۆژه میللیی‌یه ئه‌م چه‌ند خاڵانـه ده‌بێ ڕه‌چـاو بکرێت :**

١- داننـان به پێویستیی ئه‌م پرۆژه گه‌وره‌یه و بریار ده‌رکردن له لایه‌ن سه‌رکردایه‌تیی ڕامیاریی میلله‌ته‌وه تا (بانـگ ) بدرێت

بە پیرۆزیی ئەم کارە و دەستبکرێت بە هەنگاوی یەکەم و بەردی بناغەی بۆ دابنرێت.

٢- دروستکردنی ( دامودەزگایەك ) و دەرکردنی یاسای پێویست، بۆ مەبەستی ڕێکخستنی کاروبار و تەوژمدان بە کارەکە و هاندانی کارکەرانی لە هەموو ڕوویەکی مەعنەویی و ماددی و ڕێگای کارکردن و بەرهەمهێنانی نووسینیان بۆ خۆشبکرێت و بە هەموو شێوەیەك هانبدرێن.

٣- دەستکردن بە دانانی (لێژنەی تایبەتمەندی) هەر زانستێك بە تەنیا یان چەند زانستێکی لەیەکەوە نزیک و ڕێکخستنی کاروباری ئەو لێژنانەش وەك :

أ- لێژنەی زانستە (مرۆڤایەتیی)یەکان Social Sciences

زانستە کۆمەڵایەتیییەکان لە جوگرافیا و مێژوو، ئابووریی و ئەدەب و وێژە و ڕامیاریی و یاسا و ئەوانیتر و ئەو لقانەی کە بەم کۆمەڵە زانستانەوە لکاون.

ب - لێژنەی زانستی (زمانەوانیی) Linguistcs

ج - لێژنەی زانستە (پراکتیکەکان) Practical Sciences

وەك زانستی پزیشکیی و زانستی ئەندازیاریی کە بەو زانستانەوە لکاون.

د ـ لێژنەی زانستە (پێوەرەکان)

وەك زانستی کیمیا و فیزیک و ماتماتیک...هتد و هەر لێژنەیەکی سەرەکیی چەندین لێژنەی تایبەتمەندی لقی پێوەدەلکێ و هەر لێژنەیەکیان ( بەرنامەی کار ) دادەنێن و کۆبوونەوەی بەردەوامیان دەبێ لە سەر ئەوەی بە ئەنجامیان هێناوە و هەنگاو بە دوای هەنگاو پرسینەوە و بەدوواچوون دەبێ هەبێ و ئەو دامو دەزگایەی بە پێی یاسایەك دادەمەزرێ ( خاڵی دوو ) بەرنامەیەکی کاری تایبەتی خۆی دەبێ، کە ئەو یاسایە بۆی ئەخشەکێشاوە، بەرپرسیاری ئەو لێژنانە دەبێ و کاریان هەڵدەسوڕێنێ چ لە ڕووی (یاسایی، هونەریی و دارایی و ... هتد).

٤ـ کۆڕی زانیاریی کورد یان کۆڕی زانیاریی کوردستان، پاش ئەوەی دادەمەزرێتەوە و ئەندامانی چالاك و لێهاتوو دەگرێتە خۆی ، بۆ چەسپکردنی زاراوەکان و تەشەنە پێدانی ئەو زاراوانە و خولقاندنی زاراوەی نوێتر دەورێکی باڵای دەبێ.

٥ـ خێرا کردن لە خولقاندنی ( ڕێنووسێك )ی کوردیی ( پێش دەستکردن ) بە گۆڕینی زانست بۆ زمانەکەمان بێگومان دەبێ مەسەلەی ( شێوە زمانەکان، شێوە زمانی ناوچەیی ) ڕەچاو

بکرێت و بیر لەو ( زمانە زانستیی )یە بکرێتەوە کە لەگەڵ ئەو شێوە زمانەدا دەگونجێت کە لە زمانەکەمان دا هەن.

٦ـ ئەگەر (زانکۆی سلێمانی) دانرایەوە لە ژێر هەر ناوێك دا بێ، ئەوا دەبێت ئەم زانکۆیە ببێتە بەردی بناغەی بە کوردیی کردنەکانی زانست و، ئەوسا لە ڕووی داراییەوە دەبێت زانکۆ توانای داراییەکی زیاتری بۆ دابنرێ بۆ ئەو مەبەستە و دەبێت ( زانکـۆ ) پەراوێکی زۆری پێویست بە زمانە بێگانەکان - بکڕێت لە دەرەوەی وولات و گۆفار و بلاوکراوە و باسی زانستیی بۆ کتێبخانــە زانستییەکانی بهێنێ، تا یارمەتی ئەوەی بدات کە ئەو پەراوانەی پێویستن تیایاندا هەڵبژێرێن بۆ گۆڕینی بۆ کوردیی یان وەك ( سەرچـاوە ) بەکاربهێنرێت لە کاروانی زانستەکان.

٧ـ بۆ مەبەستی هێنـانە دی ئەم هیوا و ئاواتەی خوازتوومانە، هەمیشە (دامەزراندنی دامودەزگایەکی هونەریی نوێی چاپەمەنیی) یە، تا مەسـەلەی ( چـاپ ) کە ئەمڕۆ گەورەترین کۆسپە لەبەردەم نووسینی کوردیی دا - چارەسەربکرێت، کە هیچ ئامادەبوون و نووسینێکی کوردیی تاریکی شەوی بەسەردا نەیەت !

٨ـ پێویستە ( مەڵبەندێکی کەلەپوور و کەلتووری کوردیی ) دابمەزرێ و دارایی پێویستی بۆ دابنرێ تا ڕەسەنیی کوردستان

لەو ڕووەوە بپارێزرێت و ئەو شاراوە دێرینانە پەردەیان لە سەر هەڵبدرێتەوە و دەستوپەنجەی باو و باپیران مان بە ئازادیی گەلی کوردمان شـاد بێتـەوە.

٩ـ سەبارەت بە خاڵی (٨)ـەوە ئەگەر زانکۆی سلێمانی دانرایەوە باشتر وایە ئەو مەڵبەندەی ناومان برد بە ( زانکۆ )ـەوە بلکێ و کەڵك لە شارەزایـان و پسپۆڕەکانی ئەو زانکۆیە وەربگیرێ.

١٠ـ دەبێ ( پەیوەندییەکی توند و ئامانجێکی یەکمەبەست ) ئەو ( دام ودەزگا ) و ( کۆڕی زانیاریی ) و ( مەڵبەندە زانستیی ) و (هونەریی و کەلتووریی) یـانە بەیـەکەوە ببـەستێ، چونکە هەموویان بۆ یەك ئامانج و مەبەستی ( زانستیی و نەتەوەیین ).

١١ـ ئەگەر هاتوو دەرامەتێکی باش لە لایەن میریی یا سەرچاوەکانی دارایی و بودجێتی کوردستانەوە یان مەڵبەند و دام و دەزگـایەك یان ( زانکۆ ) وە بـەدەستنەهـاتن، ئـەوا نـابێ (بێپارەیی) و ( بێدەرامەتیی ) پرۆژەکە بوەستێنێ و ئەو هەنگاوە پیرۆزەی خۆمان دواخەین و دەبێ هەوڵی پەیداکردنی دەرامەت و سەرچاوەی دارایی بدەین، جا لێرە لە ڕێگای دروستکردنی (سندوقێکی میللی جەماوەریی) هاوزمانانەوە بێ، لە سەر ئاستی خەڵکی شـار و گـوند و گەلەکۆمـەکێی بـۆ بکرێ و پـارە

کۆبکرێتەوە، بۆ ئەو مەبەستەی سەرەوە و بە هۆی یەکێك یان زیاتر لەم هۆ و ڕێیانەی خوارەوە :

١٠ بەخشین ( تەبەروعات ) بە ئارەزووی خەڵکی خۆی بە پێی پسوڵەی ڕەسمیی و لەژێر چاوەدێریی و بەڕێوەبردنیی لیژنەیەکی هەڵبژێراو و ناسراوان بە دەستپاکیی !

٢٠ هاوبەشیی ڕێکخراوە پیشەیی‌یەکان و میللیی و پارتە ڕامیاریی‌یەکان لە پارەدان دا، یان پارە کۆکرێتەوە لە نێو ڕیزەکانیان دا.

٣٠ هەموو موچەخۆر و قوتابی و خوێندکارێك بە ئارەزووی خۆی مانگی ( بەپێی توانا بڕێك پارە ) بدات بۆ ماوەی (٦) مانگ.

٤٠ هەرخێزانێك جیاجیا، یان بەسەریەکەوە بۆ ماوەی (٦) مانگ ، مانگی ( بەپێی توانا بڕێك پارە ) بدات.

٥٠ پێشبڕکێکردنی وەرزشی لە نێو تیپە وەرزشیی‌یەکانی کوردستان دا و دانانی ڕێژەیەک بۆ ئەو سندووقە.

٦٠ کارگەکان و بەتایبەت کارگە تایبەتیی یەکان و بوارە بازرگانیی‌یەکان و بازرگانەکان و کاسبکارانی ناو وڵات هاوبەشیی میللی خۆیان لەم ڕووەوە بکەن، پاڵپشتی ( پڕۆژەکە ) بکەن.

٠٧ دەرکردنی بڵاوکراوەی ( سەردیوار ) و نامیلکە و لە ڕێی ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن هەمیشە هانی خەڵکی بدرێت بۆ هاوبەشییکردنی دارایی لەو پڕۆژەیە دا.

٠٨ ئەگەر توانای هەبێ هیچ خراپ نیيە کە (بلیتی یا نصیب) هەفتانە یان مانگانە بۆ ئەو مەبەستە بکرێت و چی (لا) درا لەو پارەیە بخرێتە سندووقی پڕۆژەکەوە.

٠٩ چەندین پێشنیازی تر بۆ خزمەتی پڕۆژەکە، کە بە بیری "کەسـان و لایـەنی" تردا دێت.

## دووەم /

کارگێڕان و کارکەران و هەڵسوڕێنەرانی ئەم پڕۆژەیە :

بۆ ئەم پێداویستیيە، واتـە مەسەلـەی ئەو پسپـۆڕ و کادیرانەی لەم ڕووەوە کاردەکەن، بێگومان پشتی یەکەم دەبەسترێ بەو مامۆستایانەی لە زانکۆکاندا کاردەکەن و بە تایبەت بە وانەی پسپۆڕن لەو مادەیەی خویان دا و زمانە کوردییيەکەشیان لە تەکیا باشە و لەوەو پێش باس و پەروای زانستییيان پێنووسیوە و پاش ئەمان ئەو مامۆستایانەی لە قۆناغی ئامادەیی مامۆستان و ئەزمۆن و تاقیکردنەوەی ڕۆژانەی دوور و درێژی زۆریان لە بواری خوێندندا هەیە

و سەرباری ئەمانەش پاڵببەسترێ بە هەندێك لەو ئەدیب و نووسەرانەی لە دەرەوەی بواری (پەروەردە و خوێندنی باڵا)ن کە ئەو کارەیان لە تواناڎا هەیە و ئەشێ لێ یان هەڵببژێررێ بۆ یارمەتیی دان و کارکردن بە پێی شارەزایی و توانا و لێهاتوویی یان بەو پێیانە و لە دەستە و کۆمەڵانەی سەرەوە لێژنەی هەر بوار و زانستێك دروستدەکرێت و بەرنامەی کاری بۆ دادەنرێ.

لێرەدا دەڵێین کە ئەگەر پێویستیشی کرد ئەوا باشتریش وایە، دەورەی زمانەوانیی کوردیی و ڕێنووس بۆ ئەو مامۆستایانەی تەواو شارەزاییان نی‌یە لە کوردیی نووسینەکەدا، لەو دەورەیەدا ئەو گیروگرفتە شمان بۆ ئاسان بکرێت.

سەبارەت بە خولقاندنی ئەو کادێرانە لەم دەستە و لێژنانەدا کاردەکەن و بۆ ئەوەی شارەزایی یان زیاتر تیا بخولقێ و بۆ ئەو مەبەستە دروستبن، دەبێ ساڵ بە دوای ساڵ دا ئەندامی کارامە و لێهاتوو بخولقێنرێن تا شایانی ئەو کارە پیرۆزە بن و بە لایەنی کەمەوە بۆ ئەو خولقاندنە دەبێت ئەم سەرنجانە بخەینە بەرچاو :

أ- دەبێت خۆشەویستییەکی زۆر زیاتر سەبارەت بە زمانەکەمانەوە لە نێو دڵ و گیان و مێشکی هەموو ئەندامێکی کۆمەڵ دا بچەسپێنرێت و لە دەروون مان دا شوێنی خۆی زیاتر

بکاتەوە تا بەو پێیە لە ئەنجامی خۆشەویستیی زمانەکەمان زیاتر هەوڵبدەین و زیاتر کار بکەین.

ب ـ کردنەوەی بەشی تایبەتی بە ( زانستی زمان و زمانەوانیی ) و هێنانی تاقیگەی نوێ و پێشکەوتوو بۆ ئەم بەشە و هەمیشە کەڵك وەرگرتن لەو شێوازە نوێیانەی لەم ڕووەوە میللەتان پێی گەیشتوون.

ج ـ هاندانی ئەو کادیر و کارگێڕ و کارکەرانەی لە لێژنەکاندا، کاردەکەن و سەرپەرەشتی پڕۆژەکە دەکەن، هەروەها بە پێی پێویست بنێررێنە دەرەوەی وولات بۆ بینین و چاوگێڕان بە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان دا و کەڵك لە شێوە و شێوازی ئەوان وەربگرن و لە گەڵ بار و زرووف و ڕادەی ڕۆشنبیریی وولاتی خۆمان دا بگونجێن.

د ـ ئەوانەی لە بواری وەرگێڕانی زانستدا کاردەکەن، ئەوپەڕی پاداشتی مادییان پێ ببەخشرێن وە هانبدرێن کە زیاتر بەرهەم و زانست بە زمانەکەیان ببەخشن و بەو پێیە هەموو بار و زرووفێکیان بۆ بڕەخسێ.

هـ ـ باس و نووسینی زانستیی و پەراو (گۆڕینی زانستیی) هەمیشە بۆ مەبەستی (بردنە پێش تەرقییە ی زانستیی) بخرێنە گەڕ و بۆ

پێشکەوتنی پیشەیی یان لە قەڵەمبدرێت و لێرە مەبەست لەو کادیرانەیە کە لە (کۆڕی زانکۆ ) دا نیش دەکەن.

و ـ بەستنی کۆڕ و سیمینــار و کۆنگرەی تایبەتی سەبارەت بە کاروانی ( بە کوردییکردن بە گشتی ) و گرتنی کۆنگرە لە بوار و لقەکانی زانست و لیژنە تایبەتیی یەکانی ئەو زانستانەدا یان گرتنی کۆنگرە بۆ هەر بوارێکی سەرەکیی و لە یەکەوە نزیك بە جیا و لێدوان لە کێشەکانی و دۆزینەوەی چارەکردنەکانیـان.

ز ـ هەمیشە دەبێ لیستەیەك بە ناوی ئەو کارگێــڕ و کادیرە زانستیی و پسپۆڕ و شارەزایانەی کە لە مەڵبەندە زانستیی‌یەکان و زانکۆکان دا کاردەکەن دەستنیشان بکرێت و ساڵ بە دوای ساڵ دا هەوڵی خولقاندنی کادیری نوێ و لێهاتوو بدەن تا کاروانەکە، نەوەستاوبێ و هەموو نەوەکانی ئەم میللەتە هاوبەش بن لەم کارەدا و ڕۆژ بە ڕۆژ شتی نوێ بهاوێژنــە دەریـای زمانەکەمانەوە واتە نێـو (زمانە زانستیی‌یە ) نوێکەی کوردیی مان.

## پێداویستیی سێیـەمی پـڕۆژەکـە

## ( سەرچـاوەی زانستیی و زاراوەکـان ) ـە :

گومانی تێدا نییە، کە کتێبخانەی ئێمە زۆر زۆر لە ڕووی بوونی پەراو و کتێبی هەمە جۆری زانستیییەوە تەنانەت بە زمانی عەرەبیش ئەوەندە کتێب و پەراوی زانستییمان نییە لەو کتێبخانانەدا دانرابن. جگە لە کەمێك نەبێ، کە ئەویش بە ڕێکەوت خۆیان کردووە بە کتێبخانەکان مان دا یان یەکێك خێرێکی پێکردبین، چونکە میریی هێندە گرنگی نەداوە بە کڕینی کتێب و پەراوی زانستیی نوێ و هەرگیز پارەیەکی وا پێویستی تەرخان نەکردووە کە ناستێکی ڕێکوپێك بۆ کتێبخانەکە پێکبهێنێ و دەوڵەمەندیان بکات و بەڵکوو هەروا بە هەژاریی هێشتوونیەوە و خۆ ئەگەر چاوێك بگێـڕین بە پەراوی زانستیی بە زمانی کوردیی، ئەوە ئیتر بە جارێك لە چەند کتێبی کوردیی زانستیی شتی دیکە بەرچاو ناکەوێت و ژمارەشیان چەند زۆربن لە ( دە ) پەراو تێپەڕنابن. دوور نییە پەراوێکی زانستیی لە بواری ئابووریی‌دا و پەراوێك لە فیزیك و پەراوێك لە دەروونناسیی و دانەیەك لە کۆمەڵناسیی و یاسا و مێژوو و یەکێکی کە لە بواری زاراوەکان دا( هەبێ )، هۆی ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ( ئەك ئەوەی ) کە شارەزایان

و نووسەرانی کورد لە زانستدا نانووسن و بێناگان، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ دەستکورتیی و بێدەرامەتیی نووسەر و زانای کورد و زۆر کزی پارمەتییدانیـان لە لایەن دەستە و دائیرەکانی میرییەوە، خۆ ئەگەر بەرهەمێکی قەشەنگی زانستییش لە یەکێك لە بوارە گرنگەکانیش دا بخرایەتە بەر چاوی "ئەمانەتی ڕۆشنبیریی و لاوانی لەمەڕ حوکمی زاتییە شکستەکەی سەر بە میریی" ، ئەوە وەڵامەکەیان ئەوە دەبوو کە ئەوان بەرهەمی زانستیی چاپ ناکەن و ئەو کارە زانستییە بەوان نەسپێراوە و پارەیان نییە .... !!

ئەی باشە دەبێت نووسەری کورد ڕووی خۆی بکاتە کوێ؟ بەڵام گەر دوو نامیلکەی (ووڕێنە و جوونەوە و پیاهەڵدان) بنووسرایەتەوە ئەوا لە شەو و ڕۆژێکدا بە ژمارەیەکی زۆر بۆی چاپ دەکرا و ناوی ئەو نامیلکە شەست پەڕەییە دەخرایە سەر زنجیرەیەك لەو جۆرە نامیلکە و و کتێبانە و ناگری پڕوپاگەندەیان بۆ میریی پێخۆشدەکرد و گۆیا هەموو مافەکانی کوردیان هێناوەتە دی و هیچ شتێك لە ئارادا نەماوە کە شوێنی نارەزایی بێت!! کەواتە تا ئێستا ئێمە خاوەنی هیچ کتێبێکی زانستیی نین بە زمانی کوردیی خرابێتە بەردەم هەموو خوێنەرانی کوردمان * و هۆیەکانیش لای هەمووومان

دیاره و هیچ شاراوه نییه و بەو پێیەی کە ئێمە هیچ کتێب و پەراوی زانستییمان نەبێ، دەبێت کە هیچ سەر چاوەیەکی زانستییش مان بەم زمانە نەبێ!! جا بێگومان گەر مەواد و کەرەسەی خوێندن و نووسن و تەرجەمەکراومان نەبێت کە خوێنەران پشتی پێببەستن لە نووسینی باسێك بە کوردیی و هاندان و زەمینەیەك نەبێ ئەو مەودایەی بۆ خۆشبکات ئەوە هەرگیز ( نووسینی زانستیی کوردییش ) ناخولقێ و هەمیشە خوێنەر و ئەوەکانمان دوور دەبن لەو زاراوە زانستیانە کە بە لایەنی کەمەوە ساڵی بیستهەزار (٢٠٠٠٠) زاراوەی (نوێ) لە زمانی زانستیی جیهان دا دروستدەبن و ئێمە ئەوسا لە وانە بەدەر دەبین و هەمیشە بێئاگا دەبین !!

خۆ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر (گۆڤارە زانستییەکان) و ئەو (بڵاوکراوانەی بە زنجیر) دەردەچن.. یان (کورتکراوە) زانستییەکان، ئەمانە هەموو وەك سەرچاوەیەك بۆ خوێندن و باس و نوسین... ئەوە ئیتر زیاتر لە یەك دوو گۆڤار زیاترمان هەرگیز نەبووە و ئەوانەی بە شێوەیەك دەوریان تا ڕادەیەك دیوە، وەك گۆڤاری زانیاریی و گۆڤاری ڕۆشنبیریی نوێیە باسی زانستیی تیا بڵاو بۆتەوە و گۆڤاری زانکۆ/ بەشی کوردیی یەکەی کە زانکۆی سلێمانی

دەریدەکرد و لەم دواییەش دا گۆڤاری تەندرووستیی ڕۆڵێکی خۆی دی!! نیتر زیاتر لەمانە هیچیکەی وا شك نابەین لە ڕووی زانستییەوە بە سەرچاوەیەکی زانستیی کوردیی لە قەڵەمبدرێت. کەواتە نەگەر نیمە (پەراو و گۆڤاری زانستیی و باس و بڵاوکراوەی زانستییمان) نەبێ!! چۆن خوێندکارێك دەتوانێ زیاتر فێربێت و بیر بکاتەوە و پاشان بەو پێیە بنووسێت و بتوانێ داهێنان بخولقێنێ و بەو پێیە هەنگاوەکانی گەیشتن بە میللەتانی جیهان کەمبکاتەوە و بە تۆزی پێیان دا بگات، واتە لە مەسەلەی بە (کوردیی کردنی زانست) دا خۆمان لە بەر دەم نەم کێشە و گیروگرفتانەدا دەبینینەوە، دەبێت بێ یەک و دوو هەوڵی چارەسەرکردنیان بدەین و لەوانە :

١- کەمی (پەراوی زانستیی بێگانە لە هەموو بوارەکان)دا بەڵکو کڕین و هێنانی نەو کتێبە زانستییە هەمە جۆرانە بۆ کتێبخانەکانی نەو مەڵبەندە یان زانکۆ و نەو دامودەزگایەی کە هەڵدەستێت بە کوردیی کردنی زانستەکان و لیژنەکانی بۆ مەبەستی بە کوردییکردنیان.

٢- هێنانی نەو پەراوانەی لە زانکۆکانی وولاتان دەخوێندرێت ((Textbook ))

٣- هێنانی گۆڤـارە زانستیی‌یەکـان.

٤- هێنانی باس و کورتکراوەکان، بە بە کـارهێنـانی کۆمپیوتەر و تە کنولوجیـای پێشکەوتووی سەردەم بۆ کۆکردنەوەی هەموو زانست و زانیاریی یـەك و گەڕانەوە بۆیـان لە کاتی پێویست.

٥- ئەو ( زاراوانـە )ی لیژنـەی تایبەتمەند بڕیاری لێدەدا بە لیژنـەی پوختکردنەوەش دا بڕوات تا زیاتر دوور بخرێتەوە لە هەڵە و نارێکی و تا بەو پێیەش لە لایەن نووسەرانەوە بەکار بهێنرێت و لە خوێندنی باڵا و لە نووسین و وەرگێـڕاندا بەباشی بەکـار بهێنرێت.

٦- لە هەمووی گرنـگتر (زاراوە زانستیی‌یە جیهانی‌یەکان ) بە ووتە لاتینی‌یەکەی واتە بە ( ووتنە ) کەی بەکار بهێنرتەوە لە زمانی کوردیی دا و بەو ووتنە بمێنێتەوە هەروەک چۆن زمانە زانستیی‌یەکانی جیهان وەریـان گرتووە و لە زمانی زانستدا بە کـاری دەهێنن.

٧- گۆڕینی کەلەپووری جیهانی بۆ زمانی کوردیی و ئامادەکردنی لیستەیەك بە ناونیشانی ئەو بەرهەمە قەشەنگانەی گەلانی سەر ڕووی زەمین چ کۆن و چ تازەیـان.

٨- بڵاوكردنەوە، واتە نووسینەوەی ئینسایكلۆپیدیای كوردیی لە هەموو بوارەكـانی زانست دا.

٩- دەركردنی فەرهەنگی زانستیی.

١٠- وەرگێڕانی ئەدەب و وێژە و مێژوو هەر بوارێكی دیكەی زمان و ڕەسەنی زمانی كوردیی مان بۆ زمانە بێگانەكـان ....

١١- پەنابردنە بەر تەجروبەی میللەتانی دراوسێ ی دوور و نزیكمان لە ڕووی وەرگێڕانی زانست بۆ زمانەكەیان و ئەوان بە چ قۆناغ و هەنگاوێك دا هاتوون و ڕۆیشتوون.

١٢- بۆ زانینی ئەم سەرچاوانە هەمیشە پێویستە پەنا بەرینە بەر دووا تەكنەلۆژی ناخنین و زانیاریی (كۆمپیوتەر ) كە دووا زانیاریی مان دەداتێ، واتە دەبێ لەبەردەم مان دا بانقێكی زانیـاریی هەبێت.

١٣- بێگومان زمانە دراوسێكانمـان و بەتایبەت لە بواری وەرگێڕان دا تەجروبەیەكی باشیان هەیە و چاوێك بەو تاقیكردنەوانەی ئەوان دا بخشێنینەوە هەمیشە كەڵك وەردەگرین

١٤-ووڵاتەكـانی ( مەغریب و تونس ) بۆ نموونە هەمیشـە سەرچاوەیەكی باشن و سەبارەت بەم بابەتەوە كەڵكیان هەیە و

دوور نىيه چەندين هەنگاومان بۆ ئاسان بكاتەوە و هەمان كەڵك وەربگيرێ لە ميللەتانى تر.

١٥- گومانم لەوەدا نىيە كە شارەزايان و ڕۆشنبيرانى گەلەكەمان چەندين بيروڕاى دڵسۆزانە و پەنگخواردوويان لە بير و هۆش دايە، ئەشێ ئەوانيش ئەو بير و ڕا و بۆچوونانەى خۆيان بهاوێژنە سەر ئەم پرۆژەيە و لە ئەنجامدا هەموو پێكەوە بەيەك دڵ و يەك هەستەوە بە پەرۆش بە پيركارەكەوە بێن و هێندە تەوژم بدرێت بەرەو ڕووى ئەم فرمانەوە كە هەرگيز هيچ هێزێك نەتوانێ بەرەنگارى بوەستێتەوە بێجگە لە پەراوى خوێندنى قوتابخانەكانى قۆناغى سەرەتايى، ناوەنديى و ئامادەيى ئەبێ كە زۆريان ڕێ نەدراوە بە زمانێكى زانستيى بنووسرێت يان ئەوانەى نووسراون لە ساڵانى (١٩٧٦ - ١٩٧٨) ـەوە سەرلە نوێ ئەو زاراوە زانستيى يانەى بەكارهاتوون لابران و قەدەغە كراون.

# بەرهەمەکانی د. فازیل قەفتان

١. ناميلكەی چالاك          چوار چيرۆك بۆ منداڵان ١٩٦٧

٢. ناميلكەی من كێم          زانياريی بۆ منداڵان ١٩٦٩

٣. گەشتێك بە سروشت و زانستدا ١٩٨٤

٤. التنمية الاقتصادية          بە زمانی عەرەبی ١٩٨٤

٥. الذهب الأسود          بە زمانی عەرەبی ١٩٨٤

٦. ڕژێمە ئابوورییەكان و كۆمەڵگای تەكنۆلۆژی نوێ ١٩٨٦

٧. كوخەكەی مام تۆم          وەرگێڕراو بۆ كوردی ١٩٨٨

٨. سروودی نیشتمانی و نەتەوەیی ١٩٩٨

٩. پرۆژەی بەكوردییكردنی زانست و خوێندنی باڵا ١٩٩٢
لە ساڵی ٢٠١٩ چاپكرا.



هەرگیز بەکوردییکردنی زانست یان زانست بەکوردییکردن (بەهەموو بوار و جۆرەکانیەوە) بە واتای (دەرگا داخستن و خۆجیاکردنەوە و گۆشەگیریی نی یە بە ڕووی زمان و میللەتانی دوور و نزیکی جیهان)ەوە (بەڵکو ڕاستی ئەم مەسەلەیە تەواو پڕبەپڕ پێچەوانەی ئەوەیە)، واتە لەم ڕێ یەوە نەتەوەی کوردمان دتوانێت پەیوەندیی خۆی زیاتر پتەوتر بکات بە میللەتانی جیهان و زمانەکانیانەوە، بۆ ناسین و شارەزابوونی ئەو ڕادە و ئاستەی ئەو میللەتانە لە ڕووی هونەر و ئەدەب و تێکڕای زانستەوە کە پێی گەیشتوون.

د. فازیل قەفتان


پڕۆژەی قەفتان

2019